سُورَةُ الإِخْلَاص

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ اللَّهُ الصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ ﴿٤﴾

سُورَةُ الفَلَق

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾

سُورَةُ النَّاس

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ النَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ النَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ ﴿٦﴾

## سورەتی (الإخلاص)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) (ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) بلێ: ئەو خوایەی کە ناوی الله – یە خوایەکی تاکو تەنهایە (بێ هاوەڵ و هاوتایە).

(٢) خوا زاتێکی پایەدارو دەسەڵاتدارە، نیازی بە کەس نیە و هەمووان ئاتاجی ئەون، (هەر ئەو دەتوانێت بەلاو ناخۆشی لابەرێت و پێویستی و داخوازیەکانمان جێبەجێ بکات.)

(٣) هیچ کەسی لێ نەبووە و خۆیشی لە کەس نەبووە.

(٤) هەرگیز هاوتا و هاوشێوە و دەسەڵاتدارێکی‌تر نیە کە لە بەرامبەریەوە بوەستێت و هاوشانی بێت‌و وەکو ئەو باڵادەست بێت و وەکوئە و دروستکار بێت.

## سورەتی (الفلق)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) (ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) بلێ: پەنا دەگرم بەو پەروەردگارەی کە بەرەبەیان پێش دەهێنێت، دنیای تاریك روناك دەکاتەوە.

(٢) لە شەڕو خراپەی هەرچی کە دروستی کردووە (لە جنۆکە و ئادەمیزاد و مارو مێروو..).

(٣) لەشەڕو خراپەی شەو کاتێك کە دادێت و دنیا تاریك دەبێت و شەوەزەنگ دنیادا دەگرێت.

(٤) لە شەڕو خراپەی ئەو کەسانەی کە جادوو دەکەن و پەت و دەزوو گرێ دەدەن و فووی پیادەکەن (بە فێڵ و جادوو نێوان خەڵکی تێك دەدەن کێشەو گرفت بۆ تاك و کۆمەڵ دروست دەکەن).

(٥) لەشەڕو خراپەی حەسوودو بەخیل، کاتێك کە حەسوودی و بەخیلی دەبات، (دەکەوێتە خۆی بۆ ئەوەی زەرەرو زیان بدات و کێشە بەرپابکات).

## سورەتی (الناس)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) (ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) بلێ: پەنادەگرم بە پەروەردگاری خەڵکی.

(٢) بە پادشای خەڵکی. (لە هەمو زەمین و زەمانێکدا).

(٣) بە خوای خەڵکی. (لە هەمو سەردەمەکاندا).

(٤) لە شەڕو خراپەی ئەوەی کە وەسوەسە و خەتەرە و خەیاڵ دەخاتە دڵەوە کە (خەنناسە ئەویش:).

(٥) بریتی یە لەوەی کە وەسوەسە فڕێ دەداتە سینە و دڵ و دەروونی خەڵکیەوە. (گرفتی دەرونیان بۆ دروست دەکات).

(٦) لە پەری و خەڵکی، لە جنۆکە و ئادەمیزاد (ئەوانەیان کە شەیتان سیفەتن).